Journal of Kurdish Literature
Spring and Summer 2020
Vol. VI, No. 1, Series 9

پژوهشنامه ادبیات کردی
بهــار و تابستــان ۱۳۹۹
سال ٦، شماره ۱، پیاپی ۹

# شیکاریی پێگەی دیوانی نالی وەک ئوستوورەدەق لە چاند و ئەدەبی کوردیدا

سامان ئەمجەدی [۱]

نوع مقاله: مقاله پژوهشی؛ تاریخ دریافت: ۱۸ فروردین ۱۳۹۹؛ تاریخ پذیرش: ۲۱ شهریور ۱۳۹۹؛ صص ۲٦۵-۲۸۴

DOI: https://www.doi.org/10.34785/J013.2020.149

## کورتە

ئوستوورەدەق (**Mytho-text**) بە دەق یان دەقگەلێک دەوترێ کە لە ئاستی چاندی نەتەوەیەکدا دەورێکی سەرەکی و پێکهاتەیی دەبینن. ئەم تاقمە دەقانە، وەکوو ئوستوورە و سەرنموونە دەنوێنەوە و بە وتەی هەیدیگەر جیهانێکی نوێ بنیات ئەنێن کە پەردە لە حیجابی بوون و ڕاستی لائەدەن. کراوەیی و هەڵکراوەیی ئەم دەقانە ئەبێتە هۆی درێژەداربوونی چاند و بەرگری لە هەڵوەشاندنەوەی. ئەم دەقانە بە سەرنجدان بە پێوەندییە نێواندەقییەکان (**Intertextuality**) لە ڕێگەی کارتێکردن بەسەر دەقەکانی پاش خۆیانەوە، فرەئەکەن و وەکوو ئوستوورەیەک هەمیشە لەم کاریگەری و کارتێکەرییەوە وەکوو ڕێگەچرایەک بۆ مەیدانی چاند ئەمێننەوە. ئەم وتارە دەیەوێ لە ڕێگەی باڵادەقێتی (**Transtexuality**) ژێرار ژێنێت، بیرداڕێژی فەرەنسی، بە دیوانی نالیدا وەکوو ئوستوورەدەقێک بچێتەوە. بە گوێرەی میتۆدێ کە بژێردراوە، پێگەی دیوانی نالی لە نێو ئەدەبیاتی کوردیدا هەڵدەسەنگێنرێ و لە ئاکامدا ئەوە ئەسەلمێنرێ کە دیوانی نالی دەوری ئوستوورەدەقێکی زۆر گرینگی بینیوە و ئێستاش بەسەر ئەدەبی کوردییەوە کاریگەرییەکی بەرچاوی هەیە.

**وشەگەلی سەرەکی:** دیوانی نالی؛ ئوستوورەدەق؛ باڵادەقێتی؛ ژێردەق؛ ژووردەق؛ نالی؛ ژێنێت.

## چکیده

اسطوره‌متن (**Mytho-text**) به متن یا متن‌هایی اطلاق می‌شود که در ساحت فرهنگ یک ملت نقشی بنیادی و ساختاری ایفا می‌کنند. این دسته از متون، چونان یک اسطوره و سرنمون جلوه نموده و به تعبیر هایدگر عالمی نو را بنیان می‌نهند که پرده از حجاب هستی و حقیقت برمی‌گیرند. گشوده‌گی و افراشتگی این متن‌ها موجب تداوم فرهنگ و جلوگیری از گسست در آن می‌شوند. این متون با توجه به روابط بینامتنی (**Intertextuality**) از طریق تاثیر بر متن‌های پس از خود، تکثیر شده و چونان یک اسطوره همواره در این تاثیر و تاثر به مثابه چراغ راه ساحت فرهنگ خواهند ماند. این نوشتار بر آن است که از طریق ترامتنیت (**Transtexuality**) ژرار ژنت، نظریه‌پرداز فرانسوی، دیوان نالی را همچون یک اسطوره متن بررسی نماید. مطابق روشی که انتخاب شده جایگاه دیوان نالی در ادبیات کوردی بررسی شده و در پایان این مطلب اثبات می‌شود که دیوان نالی نقش اسطوره-متنی بسیار مهم را برعهده داشته و اکنون نیز تاثیری بسزا بر ادبیات کردی دارد.

**واژگان کلیدی:** دیوان نالی؛ اسطوره‌متن؛ ترامتنیت؛ زیرمتن؛ زبرمتن؛ نالی؛ ژنت.

۱. ماستێری فەلسەفەی هونەر، زانکۆی بووعەلی، هەمەدان، ئێران ciziri89@gmail.com

## ۱ـ پێشەکی

هەر زمانێک ئەگەری ئەوە لەبەر ڕێگەیدا هەیە کە تووشی کەوتن و لەناوچوون، لەبەر هێژێمۆنی و دەستبەسەرداگریی زمانێکی دیکە بێ. مانەوە و سەربەرز دەرهاتنەوەی زمانێک، جار هەیە بە هۆی دەرکەوتنی دەقێکە کە خۆش ئەدرەوشێتەوە و هاوکات نوێنەری سەردەمی داڕماوی و، پیشاندەری دەورانێکی بەرلە سەردەمی خۆیانن. زمانگەلێک کە ئەم بەختەیان نەبووە، لە نێو زمانی دەسەڵاتدا دەتوانەوە و لەناودەچوون. بەڵام زمانی کوردی، لە کاتی ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ سەردەمی داڕمان، دەقگەلێک لە دڵیدا هەڵقوڵیون کە بوونەتە هۆی ژیانەوە و سەربەرزی. ئەم دەقگەلە بە کەڵکوەرگرتن لە بۆچوونی ژێنێت، دەکرێ بە ئوستوورەدەق ناویان لێبەین، کە بە واتای بەهرەمەندی لە پێگەیەکی سەرنوێنی و بەرچاو بۆ دەقگەلی دیکەیە.

بەرهەمە شیعرییەکانی نالی لە دەورەیەکی تایبەتدا دانراون و وەها توانێکیشان هەبووە کە بۆ دەقگەلی پاش خۆی وەکوو سەرمەشقی لێهاتووە؛ ئەم چەشنە دەقانە بۆخۆیان سەقامیان گرتووە و زمانەکەشیان بەرەو پێش بردووە. ئوستوورەدەقەکان هەروەها کە بۆخۆیان هەڵاوردەی کاریگەرییە نێواندەقییەکانی دەقگەلی پێش خۆیانن، بۆ دەقگەلی پاش خۆشیان هەر هەمان دەوردەگێڕن و لەسەر ئەوان کاریگەرییان هەیە. ژێنێت بە دەقگەلی پێش دەڵێ ژێردەق و بە ئەوانی پاش دەڵێ ژووردەق. ئوستوورەدەق دروستە لە سەرەتا بۆخۆی ژووردەقێکە و لە ژێر کارتێکەریی دەقگەلی پێش خۆی وەکوو ژێردەقە، بەڵام هێندە بەرز دەبێتەوە کە دەورێکی گرینگ لە ژیانی ئەدەبی و چاندی زمانی دەبینێ و وەها جێگایەک پەیدادەکا کە زۆربەی دەقگەلی پاش ئەو بەبێ ئامادەبوونی ئەم دەقە زەقە، نەدەهاتنەبوون. لە واقیعدا جێگای ئوستوورەیی ئوستوورەدەق بە ژووردەقگەلێکە کە لە کارتێکەریی ئەودان. ئەم دەقگەلە بە وتەی هایدیگەر جیهانێک ساز دەکەن کە ئاوەڵکەرەوەی حەقیقەتن و دەبنە پێکهێنەری مێژووی گەلی خۆیان.

گریمانەی ئەم توێژینەوە ئەوەیە کە دیوانی نالی بە هۆی هێز و توانستی ئەدەبیی شیعرەکانی، خاوەنی پلە و پێگەیەکی ئەوەندە بەرزە کە ئەکرێ بە ئوستوورەدەق ناوزدەی بکەین. پرسیاری سەرەکیی وتارەکە ئەمەیە: ئایا ئەکرێت دیوانی نالی وەکوو ئوستوورەدەقێک لە زمان و ئەدەبی کوردیدا ناوزەد بکرێت؟ سەبارەت بە پێشینەی ئەم وتارە لە زمانی کوردیدا، هیچ توێژینەوەیەک، نە بە چەشنی وتار و نە بە قەوارەی کتێب بڵاونەبۆتەوە، بەڵام لە زمانی فارسیدا چەند وتاری بەکەڵک بڵاوبۆتەوە کە ئەکرێ بە وتارەکانی بەهمەنی ناموەرموتڵەق ئاماژە بکرێت، کە بە باشی مێتۆدی ژێنێتی ناساندووە.

ئەم وتارە لە مێتۆدی باڵادەقێتی ژێرار ژێنێت کەڵکیوەرگرتووە و لەویش زۆرتر کاری بە دوو بابەتی ژووردەقییەت و ژێردەقییەتەکەیەتی. سەرەتا ئەم چەمکانە شرۆڤە دەکرێن؛ پاشان لێکدانەوەکە دێتە سەر ئەوە کە دیوانی نالی وەکوو ژووردەق شیبکاتەوە و بە واتایەکی دیکە، نالی لە ژێر کاریگەریی چ دەقگەلێکی دیکەدا بووە. ئینجا دێینە سەر باسی سەرەکیی وتارەکە؛ واتا شیکردنەوەی پلە و پێگەی دیوانی نالی وەکوو ژێردەقێک لە ئەدەبیاتی کوردیدا؛ لێرە ئەوە ئەخرێتە بەر باس کە دیوانی نالی لە کوێی ئەدەبیاتی کوردیدا سەقامی گرتووە و ئەم پێگەیەی کە هەیەتی، چۆنە کە بۆتە هۆی ئەوە کە دەوری ژێردەقێکی گرینگ بگێڕی و بگاتە تروپکێک کە شیاوی ئەوە بێ

بە ئوستوورەدەق نێوی لێبەرین. لێرە تیشک ئەخرێتە سەر سێ ڕەهەندی زمان، شێواز و ناوەرۆکی ئەم دیوانە و کاریگەرییەک کە بە سەر ئەدەبی پاش خۆی بوویەتی.

## ٢- بنەمای تیۆریک

### ٢-١- باڵادەقێتی

ژێرار ژێنێت، بیرداڕێژی فەرەنسی، کە بناغەی تیۆریکی ئەم وتارە لەسەر ئەندێشە و بیرۆکەکانی ئەو داڕێژراوە، لە بیرداڕێژە پێکهاتەخوازەکان بوو و بە بۆچوونێکی جیاواز لەوەی کە بیرمەندێکی پاشپێکهاتەخوازی وەک جولیا کریستێڤا سەبارەت بە زاراوەی نێواندەقێتی دەیگرتە بەر، بە ڕەچاوکردنی پێداویستییەکانی پێکهاتەخوازی لەگەڵ ئەم زاراوەدا ڕووبەڕوو بووەوە:

> لە ڕوانگەی ژێنێت-ەوە، نە هێما تاکەکان، بەڵکوو شێوەگەلێک سەرنجڕاکێشن کە نیشانەکان و دەق لەو ڕێگەوە، بە هۆی ڕێکخراوەکان، کۆدەکان، ڕەوتە چاندییەکان و دابونەریتەکان و ئایینەکانەوە خوڵقاون و لە چوارچێوەی ئەواندا دەوردەگێڕن. لەم لایەنەوە وا دەردەکەوێ کە هۆگریی سەرەکیی داڕێژراوی پێکهاتەخواز بەرەو کاری نێواندەقی بێت؛ چونکە ئەم داڕێژراوە نکۆڵی لە بوونی بابەتگەلی تاقانە دەکا، جەخت لەسەر سروشتی ڕێکخراو و هاوپێوەندییەکانیان دەکا؛ چ سەبارەت بە دەقگەلی ئەدەبی و چ سەبارەت بە بەرهەمە هونەرییەکانی دیکە. (آلن، ١٣٨٩: ١٤٠)

ژێنێت لە پێداگریی پێوەندییەکانی نێوان بووتیقا و ڕەخنە، بە مەبەستی پێگەیشتن بە سیستەمێکی پێکهاتەمەند، بناغەی سەرەکیترین، تەواوترین و سازراوەترین تیۆریی سەبارەت بە باسگەلی نێواندەقی دادەڕێژێ، کە بۆ خۆی ناوی ناوە باڵادەقییەت یان باڵادەقێتی. ئەو دەڵێت «ئەدەبیات وەکوو هەر کردەوەیەکی زەینیی دیکە، لەسەر ڕێککەوتەگەلێکە کە زەین، بێجگە لە نموونەگەلێکی ئاوارتە، ئاگاییەکی لێوە نییە» (کالر، ١٣٨٨: ١٦٥).

باڵادەقێتی لە بنەڕەتدا ڕاژەیەکە کە ژێنێت بە جێگەی نێواندەقێتی کەڵکی لێ وەردەگرێ و بە «پۆلێنبەندی و شیکاری لایەنێکی بەرفراوان لە ڕێگەگەلی دەنگدانەوەی دەق لە دەقی دیکەدای دەزانێت» (لچت، ١٣٨٠: ١٠٢). بەم حاڵەشەوە، ژێنێت بە هۆی ئەوە کە دەیەوێ «ئەم چەمکە بۆ ڕەسمکردنی شێوەگەلێک بە کار بێنێ کە دەقەکان لەو ڕێگەوە دەتوانن بە ڕواڵەتێکی سیستەماتیک ڕاڤە و فام بکرێن و لەم ڕێگەوە دەیەوێ مەودای نێوان ڕوانگەی خۆی و ڕوانگەی پاشپێکهاتەخوازەکان ڕابگرێت، زاراوەی باڵادەقێتی بۆ ناولێنان لە هەموو نموونەکانی نێواندەقێتی دابینکردوە و ئەمجا بە پێنج بابەتی وردتر دابەشیدەکات» (آلن، ١٣٨٩: ١٤٧). ئەم پێنج بابەتە باڵادەقێتییە پێکهاتوون لە نێواندەقێتی، تەنیشتدەقێتی،[1] باندەقێتی،[2] ژووردەقێتی[3] و ژێردەقێتی.[4]

---

[1] Paratextuality بە دەقگەلێک دەگوترێت کە دەوری ڕێکلام و ئاگادارکردنەوە بۆ دەقی سەرەکی دەبینن، وەکوو ڕووبەرگ، نێوی نووسەر و نێوی بڵاوگە و هتد.

[2] Metatextuality یان باندەقێتی، جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ تەنیشتدەقێتی نییە و بە واتای دەقگەلێک دابین کراوە کە وەکوو شرۆڤە و ڕاڤەی دەقی سەرەکی هاتوونەتە ئاراوە.

[3] Hypertextuality.

[4] Hypotextuality.

پێش لە چوونە ناو باسە سەرەکییەکەی بابەتەکانی ژێنێت، کە چوارچێوەی ئەم وتارە پێکدێنێ، بە کورتی باسێک لەسەر پێوەندیی نێواندەقێتی ژێنێت و کریستێڤا ئەورووژێنین. نێواندەقێتی وەکوو یەکێک لە بابەتەکانی باڵادەقێتی ژێنێت، جیاوازیگەلێکی زۆری لەگەڵ نێواندەقێتی دانەرەکەی، واتا کریستێڤا هەیە. ژێنێت بە دوای پێوەندیگەلێکی نێواندەقی دەکەوێ کە زۆر کردەوەیی و دیار لە نێوان توخمەگەلێکی تایبەت لە دەقگەلێ جیاوازە، تا کە وەکوو کریستێڤا شوێنکەوتنی دەلالەتگەلی پێچاوپێچی نیشانەکانی دەق لە دەقەکانی دیکەی مەبەست نەبێ. لەبەر ئەمە، نێواندەقییێتی کریستێڤایی بە دوو بابەتی ژووردەقێتی و نێواندەقێتی لەژێر زاراوەی باڵادەقێتی کەمدەکاتەوە؛ بەڵام ئەم وشە، واتا نێواندەقێتی، لە لای ژێنێت بە پێوەندیی نێوان دوو دەق، کەمدەکرێتەوە؛ هەڵبەت ئەمە بە هۆی ڕوانگە پێکهاتەخوازانەکەیەتی کە دەیەوێ بەرەو لای ناساندن و ئاکامبەخشی بڕوا.

## ۲-۲- ژووردەقێتی

دواهەمین دەستە لە بابەتە باڵادەقێتییەکانی ژێنێت، ژووردەقێتییە کە خاڵی قورسایی باسگەلی باڵادەقییە؛ «چەمکێک کە ناوەندی سەرەکیی توێژینەوەی ژێنێتە» (لچت، ۱۳۸۳: ۱۰۳). ژێنێت ژووردەقێتی وەها پێناسە دەکا: «هەر جۆرە پێوەندییەک کە دەقی «ب»... بە دەقی پێش‌تر، «ئەلف» گرێ ئەدا... بە جۆرێک کە ئەم پێوەندییە شێوە و بیچمی شرۆڤە و پەراوێز [سەبارەت بە دەقی ئەلف] بەخۆنەگرێ» (۱۰۳). دەقی «ب» ناتوانێ بەبێ دەقی «ئەلف» بوونی بێ، بەڵام سەبارەت بە ئەو نادوێ،؛ «یانی شێوەی پێوەندیی ئەم دوانە بە چەشنێک نییە کە دەقی «ب» شرۆڤەی دەقی «ئەلف» بێ» (آلن، ۱۳۸۹: ۱٥٦).

ئەوەی کە ژێنێت بە «ژێردەق» ناوی لێ‌ئەبا، هەر ئەو چەمکەیە کە زۆربەی ڕەخنەگرانی دیکە ناویان ناوە نێواندەق، «یانی دەقێک کە بە ڕاشکاوی دەتوانێ لە سەرچاوە سەرەکییەکانی دەلالەت بۆ دەقێک بێ; لەم ڕوانگەوە *ئۆدیسە*ی هۆمەر نێواندەقێک یان بە وتەی ژێنێت ژێردەقێکی سەرەکی بۆ *ئۆلیسێس*ی جەیمز جۆیسە» (۱٥٦). ژێنێت لە بەکاربردنی ژێردەقییێتی بە بیچمگەلێک لە ئەدەبیات دادەگەڕێتەوە کە بە ئاشکرایی و بە ئاگایی نێواندەقین. ژێنێت پێوەندییە ژووردەقییەکان لە نێوان دوو دەقی تەواو و سەربەخۆ دامەزراو دەبینێت کە بوونی یەکێکیان، «ژووردەق»، بە بوونی ئەویدی، «ژێردەق»، بەسراوەتەوە. ژووردەقێتی پێوەندییەکانی هەڵگرتنەوەی دەقێک، واتا ژووردەق، لە دەقی پێش‌وەخۆ یانی ژێردەقە. «ژووردەقێتی شێوەی فرەبوونەوە، بڵاوبوونەوە و پاتەوەی دەقێک (ژێردەق) یان دەقی دایک لە دەقەکانی دیکەیە (ژووردەقەکان)» (نامورمطلق، ۱۳۸۷: ٥٤). ئێستا بەم پێناسەیە دەگەینە پێداچوونەوە لەسەر ژێردەقگەلێکی تایبەت کە بە ئوستوورەدەق ناوزەدکراون.

### ۲-۲-۱- ئوستوورەدەق

ئوستوورەدەق بە پێی ئەم پێناسەیە، «ژێردەقێک ئەگەر ژووردەقگەلی زۆری هەبێ، یانی بە شێوەیەکی بێ‌وێنە لێ‌وەرگیرابێ، ئوستوورەدەقی ناوە» (٥٤). ئەم دەقانە دەبنە هۆی بەردەوامیی بەشە چاندییەکانی کۆمەڵگایەک بە درێژایی مێژوو و ئەم بەشانە بە پەرەپێدانەوە بە خۆیان لە بەرەیەک بۆ بەرەیەکی دیکە ڕائەگوێزرێنەوە. «بۆیە، دەوری گرینگی ئوستوورەدەقەکان، بەردەوامیی

چاند و بەرگری لە لەبیرچوونەوە و دابڕانی چاندییە. بەم پێوەرە، یەکێک لە گرنگترین پێناسەکانی ناسینی چاندی نەتەوەیەک، ناسینی ئوستوورەدەقەکانی ئەو چاندە و ئاڵوگۆڕەکانیەتی» (۷). وشەی ئوستووره لە نێو زاراوەی ئوستوورەدەقدا بە پێناسەیەکی نزیک بە پێناسەکەی بارت لە ئوستووره بەکاربراوە؛ واتە هەر شتێک کە «چرکەیەکی شاراوە یان دیاری بە درێژەی کات و شوێنی [هەیە و ئەگەری] بوونەنموونەی بۆ پاتەوەبوون و زۆربوونەوە هەیە» (۷).

ئوستوورەدەقێک، وەکوو ئوستووره، بە نموونەبوونیەوە لەدایکدەبێتەوە، بە پاتەوەبوونیەوە ئەژیێتەوە و پانتایی و هێزی بە گوێرەی ئەژماری پاتەوەبوونی کەم یان زیاد دەبێتەوە. پێوەندییەکانی ئوستوورەدەق لەگەڵ ژووردەقەکانی، بە هۆی بەرفراوانییەوە، چەشنگەلێکی زۆری هەیە. «بە گشتی، پێوەندیی ژێردەق و ژووردەق، دەکرێ بەسەر دوو تاقم دابەش بێتەوە؛ لێکچوویی یان لاسایی و ئاڵوگۆڕی» (۵۵) پێوەندیگەلی لێکچوویی دەبێتە هۆی ئەوە کە ژووردەق لەسەر بناغەی لاسایی‌کردنەوە و پاتەوەکردنی ئوستوورەدەق وەکوو ژێردەقێک پێکبێ، بەڵام پێوەندیگەلی ئاڵوگۆڕی، ئەم ئیزنە ئەدەن کە بە شێوەگەلی جۆراوجۆر، ژێردەق ئاڵوگۆڕی بەسەردابێت.

### ۳- نالی وەکوو ژێردەق

بۆ پێناسەکردنی نالی وەکوو ژێردەقێک بۆ ئەدەب و چاندی کوردی، دەبێ لە سەرەتا لەسەر ئەوە کە نالی چی کردووە لێبکۆڵینەوە و لەسەر خاڵە گرینگەکانی ڕۆبچینەوە و بە پۆلێنبەندی‌کردنی، دواتر لەسەر ژووردەقەکانی ئەدوێین. یەکەم خاڵ کە دەبێ باس بکرێت زمانە و هەوڵی نالی بۆ بەستانداردکردنی زمانی کوردی؛ دواتر شێواز یان سەبکی شیعرەکانی ئەم کەڵەشاعیرەیە، کە بە بڕوای زۆرێک، لە هەردوو بابەتەوە لە شێوەزاری کرمانجیی ناوەڕاست واتە سۆرانی، نالی یەکەم دانەریانە. دواتر دێینە سەر باسی بابەت و چەمک.

### ۳-۱- زمان

زمانی کوردی بە تەواو زارەکانیەوە کۆنتر لەوەیە کە نالی یەکەم شاعیری بێ. هەروەها لە زاری سۆرانیدا، بە دڵنیاییەوە جێی گومانە نالی بە یەکەم کەس دابنین کە بەم زارە نووسیبێتی و شیعری گوتبێ؛ بەڵام تا ئێستاش زۆرێک لە توێژەران هەر ئەو بە یەکەم کەس دەزانن. هەرچەند گرینگ نییە کە نالی یەکەم کەس بێ یان نە، چونکە نالی ئەگەر کەسێکی لەپێشەوە بێ، ئەبێتە ژووردەق بۆ ئەوانە و وێڕای ئەوەش ئاستی بەرزی شیعری نالی بە جۆرێکە کە تەنانەت لە نێو سێ‌کوچکەشدا هاوسەری بۆ نییە و وەها دیارە کە بە ئوستوورەدەق دەبێ ناوی لێ‌ببەین، ئەرکێک کە ئەم وتارە گرتوویەئەستۆ.

هۆی جێی‌گومان‌بوونی بە یەکەم کەس زانینی نالی ئەوەیە کە لەگەڵ سالم و کوردی هاوچەرخە و ئەگەر لە سەردەمی ئەواندا ئەم کارە ڕوویدابێ، ڕوون نییە لە لایەن کامیانەوە بووبێ و تەنیا ئاست‌بەرزی پلە و بەهێزتربوونی شیعرەکانی نالی نابێتە هۆی سەلماندن و سەپاندنی ئەم باسە. بێجگە لەمەش، محەمەدعەلی قەرەداغی لە وتارێکیدا ناوی پێنج کەس ئەهێنێ کە پێش نالی بە سۆرانی شیعریان گوتووە، واتا: «مەلامحەمەدی ئیبنولحاجی بانەیی، مەلا محەمەدی سیوچی بە نازناوی جەفایی، کارێزی، دەردین، ڕەنجووری» (قەرەداغی، ٢٠٠٦: ٣٩٤). نالی چ یەکەم کەس

بێ، چ کەوێتە دواوە، بۆ باسەکەی ئێمە گرینگ نییە و ئەم وتارە لێرە دەیەوێ لەسەر زمانی شیعری نالی و ئامانجەکانی ئەو شاعیر و ئەدیبە پایەبەرزە بدوێ.

نالی بە دڵنیاییەوە یەکەمین کەسە کە خولیای دابینکردنی زمانێکی ستانداردی کوردیی هەیە. ڕەنگە ئەمە ئیدعایەکی زۆر گەورە بێ و لە ڕواڵەتدا بۆ سەلماندنی، هیچ بەڵگەیەک بەدەستەوە نەبێ، بەڵام بە پێچەوانەوە باشترین بەڵگە، دیوانە مەزنەکەیەتی کە ئەو هەوڵ و تێکۆشینەی نالی بۆمانی ڕاگرتووە. نالی لە دیوانەکەیدا هەوڵی زۆری بۆ ئەم کارە داوە و وێڕای ئەوەش بەڵگەیەکی دیکەش کە بەدەستەوەیە، توێژینەوە زمانەوانییەکەی خۆدزکۆیە کە لەوێ لە زاری ئەحمەد پاشای بابانەوە باسی نالی دەکا و دەڵێ «ئەو زاتە پسپۆڕ و شارەزایە بەهرە و توانای خۆی بۆ لێکۆڵینەوە لە دیالێکتە جیاجیاکانی کوردستانی زێد و نیشتمانەکەی تەرخانکردووە» (خۆدزکۆ، گێڕانەوە لە حەداد، ٢٠٠٦: ٣١). ئەم بەڵگە کە یەکێک لە بەڵگە دانسقەکان لەسەر ژیانی نالییە، بۆمان دەردەخا کە نالی ئەدیب و زمانزانێکی پسپۆڕ و زانایە و هەوڵی ئەوەی بووە کە دیالێکت و شێوەزارەکانی کوردستان کۆکاتەوە و، لە ڕووی دیوانەکەی بۆمان دەردەکەوێ کە ئامانجی سەرەکیی ئەو لەو کارە، پێکهێنانی زمانێکی ستاندارد بۆ کورد بووە.

هەندێ کەس، وەک عەتا قەرەداغی، پێیان وایە کە نالی لە بواری زمانەوە داخراو بووە و پێوەست بووە بە دەسەڵاتی بە قسەی ئەو خێڵەکی و عەشیرەیی بابانەکانەوە (قەرەداغی، ٢٠٠٦: ٩٨-٩٧). بە بێ یەک و دوو، بۆ هەردووی ئەوانە کە ئەو بە خێڵەکی ناویان لێدەبا، ئەم بەڵگەی خۆدزۆکۆیە پووچەڵکەری ئیدعاکەیەتی و وامان بۆ دەردەخا کە هەم بیری نالی و هەم بیری ئەگەر نەڵێین تەواو بابانەکان، لانیکەم بیری ئەحمەد پاشا بیرێکی بەرفراوان و نەتەوایەتی بووە. هەروەها کە ئاماژەی پێ کرا، نالی لە ڕووی زمانەوە هەندێ وردەکاریی هەیە، کە بەگوێرەی دەرفەتێک کە هەمانە، قامک دەنێینە سەر هەندێکی:[1]

١- «لەپاڵ **من**، کە ڕاناوی یەکەمە گەلێ جار پەنای بۆ شێوەزاری موکریانی-سۆرانی بردووە و **ئەمن**-ی بەکارهێناوە یان لە کرمانجی ژوورەوە کەڵکی لە ڕاناوی **ئەز** بردووە» (مەلا ساڵح، ٢٠١٣: ٢٣٦).

ناری سینەم گـەر نەبێ، غەرقم **ئەمن**
ئاوی چـاوم گـەر نەبێ، سووتاوم **ئەز**
(نالی، ١٣٨٧: ٢٣٢)

٢- «یەکخستنی هەردوو ڕاناوی **تۆ- من** بە شێوەی **تۆم**، وەک دەڵێ» (مەلا ساڵح، ٢٠١٣: ٢٣٧):

هەتا **تـۆم** ئاشنـا بووی ئاشنـــام بوون
ئەمێستـا موو بـە مووم ئەغیـــارە بێ تۆ
(نالی، ١٣٨٧: ٣٩٣)

کەوایە، بە پێوانەی زمانی باو دەبا بیگوتایە: هەتا تۆ ئاشنام بووی.

---

[1] خوێنەر بۆ زانیاری زۆرتر ئەتوانێ بڕوانێتە وتارە بەنرخەکەی حەکیم مەلا ساڵح لە گۆڤاری کۆچ ژمارەی ١٩و ١٨، لل ٢٥٤-٢٣٥.

٣- «گۆڕینی پێشگری **ئە** لەکاردا بە **دە**، وەکوو لە بابانیدا دەگوترێ: ئەخۆم، ئەڕۆم و هتد. وەک دەڵێ:

گەر **دە**پرسی مـن لەبەرچـی کـەم **دە**خـۆم
مـن بە برسـی قـەت مـەزانە خـەم **دە**خـۆم»
(مەلا ساڵح، ٢٠١٣: ٢٣٨)

٤- «بەکارهێنانی **دەبێژم** کە لە شێوەزاری کرمانجی ژوورەوە بەکار دێ بە جێگەی **ئەڵێم**، کە تایبەت بە بابانە» (٢٤٠):

دەورانییە، وەک هێڵەکی سەودا، سەری گێـژم
بۆیە بە دەقیقـی مەسەلـە هەرچـی **دەبێـژم**
(نالی، ١٣٨٧: ٢٨٦)

هەروەها چەندین و چەند وردەکاریی زۆری دیکە هەیە کە لێرە دەرفەتی وروژاندنی بە تەواویمان نییە و بۆ کۆتایی ئەم باسە، دێڕەشیعرێکی لێ دێنین کە دوو وردەکاری و هەوڵی نالیمان لەپێناو بەستانداردکردنی زمانی کوردی بۆ دەردەخا. مامۆستا مودەڕیس یان یەکێک لە کوڕەکانی لە پەراوێزی کۆتایی ئەم پارچە شیعرەدا دەڵێن: «ئەمەی نالی کردوویەتی، وەک کەرەستەیەک بۆ لێکۆڵینەوەی مەسەلەی زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کورد و موتوربەکردنی بە هەموو زارەکان، شتێکی بەبایەخە» (٢٣٤).

ئەی ڕەفێقـان سوحبەتـی نالـی مەکـەن
بـۆچ؟ کە مـن **لـەوڕا** وەکـوو بەدنـاوم **ئەز**
(٢٣٤)

تەنیا باسێک کە ئەمێنێ، ئامادەیی ئەو هەموو وشە بیانییەی نێو شیعرەکانی نالییە کە ڕەنگە ببێتە هۆی ڕەخنە لەو ئیدعای کە کردوومانە. پێش بەوە کە لە ڕوانگەی نالی خۆیەوە وەڵامی ئەم ڕەخنە بدەینەوە، دەبێ ئاماژە بەوە بکەین کە شیعر و ئەدەبی عەرەبی لێ بەدەر بێ کە بە هۆی زاڵبوونیەوە کەمترین کارتێکەریی زمانگەلی بیانی بەخۆوە بینیبوو، زمانی فارسی و تورکیش جیاوازییەکی وەهایان لەگەڵ کوردی لەم بوارەدا نەبوو. دەبێ پێش بە دەربڕینی ئەم ڕەخنە و بە جیدیگرتنی، ئەبێ چاوێک لە شیعری فارسی و بۆ وێنە شیعری حافز بکەین تا ئەوەمان دەست بکەوێ کە لە وشەی عەرەبی لێوانلێوە. هۆکارەکەشی بە سانایی کاریگەریی دین و بە تایبەت ئەدەبیاتی عیرفانی لەسەر شاعیرانی ئەو سەردەمە بوو. سەبارەت بەم ڕەخنە، نالی بۆخۆشی بێدەنگ نییە و هۆکاری کەڵکوەرگرتنی لەو هەموو وشە بیانییە لە شیعرەکانیدا، بەتایبەت ئەم دێڕەشیعرەی خوارەوە دەردەخا، کە دەڵێ:

فارس و کورد و عەرەب هەر سێم بە دەفتەر گرتووە
نالی ئەمڕۆ حاکیمی سێ موڵکـە، دیوانی هەیـە
(٥٨٢)

تەنانەت ئەکرێ دێڕێکی دیکەی نالی کە بە بۆنەیەکی دیکەوە باسی کردووە، هەر لێرەش و بەم بۆنەشەوە بە کار بێنن کە دەڵێ:

گێل ئەگەر تورکــی، تعــال ئەر عــەرەبی
بێ ئەگەر کــوردی، ئەگــەر فورسی بیــا
(١٢٣)

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ کە نالی مەڵبەندی ئەدەبیات بە تەنیا مەڵبەندێکی ئەدەبی نازانێ و ئەگەر سەرنج بە هاوکاتی ئەو لەگەڵ داڕووخانی دەسەڵاتە کوردییەکان، بەتایبەت بابانەکان بدەین، ئەوەمان لێ دیارئەبێ کە نالی هەوڵی سەرکەوتنی کوردیەتی. ئەگەر لە دونیای واقعیدا ئەوە دەستی نەداوە، دەبێ لە ئەدەبدا ئەوە بخوڵقێنێ؛ ئەوەیە کە ڕێزمان و نەحوی شیعرەکانی هەر کوردین. بۆخۆشی دەڵێ:

تەبعی شەککەرباری من کوردی ئەگــەر ئینشا دەکــا
ئیمتیحانی خـۆیە مەقسـوودی لە عەمـدەن وا دەکــا
(١٠٢)

ئەمە ڕێبازێکە کە ئەگەر نەڵێین نالی لە نێویدا تەنیایە، بە دڵنیاییەوە ئەتوانین ئەوە ببێژین کە گەورەسواریەتی. نالی لەگەڵ ئاوەڵانی، واتا سالم و کوردی، تێکۆشین بە پێچەوانەی زانایانی هاوچەرخیان بە کوردی بنووسن و بهۆنن و بایەخبدەنە زمانی زگماکیان. ئەم ڕێبازە بە مەحوییەوە درێژەی پێئەدرێت و ئەگاتە حاجی قادر کۆیی و شێخ ڕەزا تاڵەبانی، حەریق، حەمدی، ناری، بێخود و...؛ پاش ئەم گەورە شاعیرانە، ئەم ڕێبازە بە بەرهەمەکانی ئەوڕەحمان بەگی بابان، شێخ نووری، پیرەمێرد و گۆران دەچێتە ئاستێکی بەهێزتر و گەشاوەترەوە. بەڵام ئەوەی ڕاستی بێ، دەوری نالی زۆر زەقتر و، بە هۆی بەهێزیی شیعرەکانیەوە زۆر بەرچاوترە. «دەتوانین بڵێین [پەرەسەندنی زمانی کوردی] لە سەرەتایساڵەکانی بیستی سەدەی نۆزدەهەمەوە بە شێوەیەکی هونەریی و ڕێکوپێک سەریهەڵداوە. ئەم مێژووەش، یادگارەکانی میرنشینی بابان و، نالی، هۆنەر و بلیمەتمان بیردەخاتەوە» (محەمەدعەزیز، ٢٠٠٥: ٢٩٧).

هەروەها محەمەدی مەلا کەریم لە پێشەکیی *دیوانی مەحوی*دا دەڵێ «لەناو ئەوانەدا کە ڕێچکەکەی نالییان گرت و ئەو ئەرکەیان بەجێگەیاند کە داهێنانی قوتابخانەی شیعری نالی لە ئەدەبی کورددا لە ئەستۆی خۆی گرت، سالم، کوردی، مەحوی و شێخ رەزا، ئەو چوار کەسەن کە لە پێشی هەمووانەوە دەوەستن» (مەحوی، ١٣٨٧: ٣-٣٢). هەروەها کە دەزانین، پێشتر لە زارەکانی گۆرانی و کرمانجیدا هۆنەران و شاعیرانی گەورەی وەکوو خانای قوبادی، مەلای جزیری، خانی و... پێشەنگی ئەم ڕێبازە بوون و وەکوو ژێردەقێکن بۆ نالی و سەردەمی بابان. مەحوی لە ژێر کاریگەریی نالی کە دەڵێ «تەبعی شەککەرباری من کوردی ئەگەر ئینشا دەکا...»، وەهای هۆنیوەتەوە:

بنووسە، پیری دڵم ئەمری کـرد، ئیتاعەتم کــرد

لە ئیبتیــداوە کــە بەیتــی موناسبــی دیــوان
گەدایەکی وەکوو مەحوی قەلەندەرێکی کـورد
میســـالی پادشەهــی فورسـە ساحیبی دیـوان
(مەحوی، ١٣٨٧: ٣٩٣)

حاجی قادریش هەر لە ژێر ئەو کاریگەرییە و سەر بەو ڕێبازە، دەڵێ:

مەڵێن فەساحـەتی کـــوردی بە فــارسی ناگــا
بەلاغەتێکــی هەیــە هیـــچ زوبانێ نایگـــاتێ
(حاجی قادر کۆیی، ١٣٩٦: ١٧)

لە ئاکامیشدا ئاماژە بە دێڕێکی پیرەمێرد دەکەین کە بەرەی نوێترە و سەر بە هەمان ڕێبازی نالی‌یە:

ئێـمـــــــە کـە کـــــوردین لەلامـــان وایـــە
کــــوردیی زبانێکـــــــە زۆر بێ‌هـاوتــایـــە
(پیرەمێرد، ١٣٨٦: ٣٤٧)

تێکۆشان بە زمانی کوردی و بە زمانی کوردی و بۆ دەستەبەرکردنی زمانێکی یەکگرتوو، بەتەواو کەم‌وکوڕییەکان و کەمایەسییەکانیەوە، لە نالی دەستی‌پێکرد و بەو هۆنەرانە، کە ناومان‌برد، درێژەی‌پێدرا و ئێستاش ئەم هەوڵە چەن دەیەیە چۆتە نێو قۆناغێکی جدیتر و زانستیتر و بە تەنیا لە نێو سنووری ئەدەبدا نەماوەتەوە و هەوڵی زانستیانەی بۆ ئەدرێت.

### ٣-٢- شێواز

شێواز زاراوەیەکی کۆنە لە سەرەتای سەرهەڵدانی ئەدەبیاتەوە هاتۆتە ئاراوە و لە وشەی Stylusی یۆنانی کەوناراوە هاتووە. «لە عەرەبیدا ئوسلووب بە واتای ڕێگا، ڕێڕەو، ڕێچکە، ڕێباز بەکارهاتووە» (کاکی، ٢٠٠٨: ١٤). هەروەها لە فارسیدا بە سەبک ناوبراوە،«سەبک لە زاراوەی ئەدەبیدا بریتییە لە ڕێبازێکی تایبەتی بۆ تێگەیاندنی خوێنەر» (١٤). لە زمانی کوردیدا «بە واتای ڕێگا، ڕێباز، ڕێڕەو و شێوە و خووڕەوشت و هەڵس‌وکەوت» (١٤). هەروەها کە لە کۆی باسگەلی سەرەوە وەها تێدەگەین کە شێواز بە واتای پێناسەی تایبەتمەندییەکانی بەرهەمی هونەرمەند بەگشتی و، شێوازی شیعریی شاعیر و پەخشانی نووسەرە بەتایبەت، کە شۆناسی ئەو هونەرمەندە لەو هونەرەدا پیشان دەدا. لە ئەدەبیاتی ئەمڕۆی جیهاندا شێواز وشەیەکی نوێ و کارێکی زانستیی تازەیە و لە فەرهەنگ و زمانی کوردیشدا، ئەگەر نەڵێین هەر نەناسراوە، دەتوانین بڵێین لەم بابەتەوە زۆر کەم کارکراوە و جێگەی وەکوو لقێکی زانستی لە زانکۆکاندا بەتاڵە.

شێوازی شیعری نالی، شیعری سەروایی و بە کێشی عەرووزییە. ئەگەر لە کێشەی یەکەم‌کەس‌بوون و نەبوونی نالی بەم شێوازە چاو بنووقێنین، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە لەم شێوازەدا نالی زۆر لە ژێر کاریگەریی شیعری فارسی و عەرەبیدایە. لەم بوارەدا نالی لە بەرزترین ئاستدا شیعری گوتووە. ئەگەر بێین و دوو ئاستی فۆرم یان بیچم و ناوەرۆکی بەرهەمەکانی ئەم شاعیرە لێک‌بدەینەوە، ئەوەمان دەست‌ئەکەوێ کە بە هەردوو باردا هاوسەنگن و لە قەوارەی شیعری

کلاسیک کەسمان نەبووە کە بگاتە ئەو لووتکە بەرزە، کە نالی یانەی شیعری کوردیی پێ گەیاندووە و گەشاندۆتەوە.

ئەگەر لە چوارچێوەی بابەت و مێتۆدی ئەم وتارەدا باس بکەین و تیشک بخەینە سەر شێوازی شیعرەکانی نالی، وەکوو ژێردەقێک، ئەبینین کە نالی سەرەڕای ئەوە لەسەر شاعیرانی پاش خۆیەوە کاریگەرییەکی ئەوتۆی هەبووە، بەڵام چوارچێوە و شێوازە شیعرییەکەی دەستکردی خۆی نییە و ئەمیش هەروەها کە ئاماژەی پێکرا، لە ژێردەقگەلێکی دیکە کە زۆرتر لە زمانگەلی فارسی و عەرەبیدا ئامادەییان هەبووە کەڵکی وەرگرتووە و بۆتە پردێکی باش بۆ گواستنەوەی ئەم چوارچێوە شیعرییە بۆ زمانی کوردی و هەرچەند بە دڵنیاییەوە هیچ شاعیرێکی پاش خۆی نەیتوانیوە بگاتە ئەو ئاستە بەرزە کە ئەم پێی گەیشتووە. سەبارەت بەم بابەتە، ئاماژە بە شیعرێکی سالم وەکوو ئاوەڵی نالی جێگەی سەرنج و سەلمێنەری پێشەنگ بوون و بەرزیی ئاستی نالییە:

لە یەک لا «نالی»ی و «مەشوی». لە لایێ «سالم» و «کوردی»
لە هەنگامــەی هونەرگــەرمی، تکاجــۆ بوون لە «مەولانــا»
لە مەیدانــی بەلاغەتــدا بە ســواری مەرکەبــی مــەزموون
بە کــوردی، هـــەر یەکەتــازی ســەوارێ بوون لە بابـانــا
کە «نالی» تەوسەنی تەبعی بـە تەرزێ گــەرم جوستــەن بــوو
بە چەوگانــی خیــرەد گــۆی دانشــی دەرکــرد لە مەیدانــا
کە ڕەخشــی تەبعـــی ڕامــی هاتـە سـەر میقرازەکـی تەعلیم
ڕیکابـــی پـایبۆسـن «سالمــــــ» و «مەشـــوی» لە دەورانــا
(سالم، ٢٠١٥: ٨٤)

## ٣-٣- ناوەرۆک

شیعرەکانی نالی لە ڕووی ناوەرۆکەوە زۆرتر عاشقانەن و بەشێکیشی ئایینین. نالی لە لایەکەوە بۆ ئەوە کە یەکەم کەس یان لە ئەوەڵین کەسگەلێکە کە بە کوردیی سۆرانی هەستی خۆی دەرخستووە، گرینگە؛ سەرەڕای ئەوەش، هەر ئەو بابەتانەی بە جوانترین و بەنرخترین شێوە پێکهێناوە. ئەوەیە کە ئەگەر نالی، ئەم کەڵە شاعیرەش کە هەیە نەبوایە، هەر بە هۆی ئەوە کە ڕچەشکێن بووە، جێگای سەرنج و بایەخ دەبوو. بەڵام ئێستا «بەو تایبەتمەندیانە کە لە شیعری نالیدا دەبینرێ، بێگومان ئەم شاعیرە پایەبەرزە لە ئەدبیاتی کلاسیکی کوردیدا بە ناوی شاعیرێکی خاوەنسەبک دەناسرێ، چونکە زۆربەی شاعیرانی گەورەی کورد دوای نالی لەو تەئسیریان گرتووە و شیعرەکانیان ڕەنگی شیعری نالی-ی لێنیشتووە. بەو هۆیەوە مەقامی نالی لە ئەدەبی کوردیدا بەرابەری مەقامی خاقانی و شێخی سەعدییە لە ئەدەبی فارسیدا» (روخزادی، ٢٠٠٦: ١٥١).

هەروەها «نەمرێکی وەکوو حاجی قادر لە دە جار زیاتر شایەدیی بۆ بلیمەتیی نالی داوە. بە دوا حاجی قادریشدا، هەموو ئەو شاعیرە کوردانەی بە زاراوەی نوێ پێیان دەڵێن کلاسیک، لە ڕاستیشدا ڕۆمانتیکن، نالییان بە پێشەوای شیعری کوردی داناوە» (محەمەد، ١٣٩٦: ١٤٤). هەروەها کە باسی لێوە کرا، زۆربەی شاعیرانی کوردی پاش نالی، لە ژێر کاریگەریی نالیدان و نالی وەکوو

ژێردەقێکی هەرە دیار کە نێوی ئوستوورەدەقمان لێناوە، لە ئەدەبی کوردیدا ئەدرەوشێتەوە. لە یەکەمین شاعیرانی هاوچەرخیەوە ئەم کارتێکەرییە دەستپێدەکا، کە لێرە بەدواوە بە چەند نموونەیان ئاماژە دەکەین. نالی دوو دێڕەشیعری بەرز و واتاناسکیی هەیە کە حاجی قادر هێناویە نێو هەڵبەستی خۆیەوە. نالی دەڵێ:

کــــە هــــاتی تیغــــــی «بێزاری»ت لــەســـەر دامـــــ
سـەری خۆمـــ خـــودبەخـــود هەڵگـرت و ڕۆییمـــ
(نالی، ۱۳۸۷، ۳۲۲)

گوتـم ئایــا بە زاری خۆت دەپرسی حاڵی زاری مــن؟
بڕۆی هێنایە یەک وەک شکڵی «لا» یەعنی کە «بێزارم»
(۲۸۲)

حاجی قادر هەر هەمان کایەی نالی بە وشەی «زار» و «بێزار»ی وەها هێناوە:

نەقـاشــــی «دم»ی نوقتـەکــــــی دانـــا بە نیشـانی
زانــــی کــە «ذمــ»ی کــــردوە «بێــزار»ە لە مـــانی
(حاجی قادر، ۲۷۰۷: ۱۵۰)[۱]

نالی دێڕەشیعرێکی هەیە کە لەوێ دەڵێ:

سەرخۆشـــی شەرابـــی دەمـــی تـــۆ بووم و ئەمێستـــاش
قوربان سـەری تـۆ خـۆش، کە نەمـاوە سـەری خۆشم!
(نالی، ۱۳۸۷: ۲۹۲)

مەحوی، هەر بەو شێوە، ئەو کاکڵە واتاییە و ئەو کایە بە وشەی «سەر»، «خۆش» و «سەرخۆشی» دەگوازێتەوە نێو دێڕەشیعرێکی خۆی:

ســـــەر و ســامــــانمت پــرســــی، مــەپرســــــــــە
ســـەری تۆ خـۆش، نـە ســــەر مـاوە نـــە سـامـــان
(مەحوی، ۱۳۸۷: ۲۸٤)

لەو شاعیرانە کە لە ژێر کاریگەریی نالیدا وەکوو ژووردەقێک شیعریان گوتووە، کەمالی (کەماڵ عەلی باپیرئاغا) بووە کە چامەیەک لە چەشنی چامە مەنشوورەکەی نالی، کە بۆ سالم نووسیبووی، بۆ هەواڵێکی هەڵەبجەیی شاعیری (ناتیق) ئەنووسێ و نالیئاسا کە لە غەریبیدا هەواڵی سلێمانی دەپرسێ، ئەمیش لە کەرکووکەوە هەست بە نامۆیی دەکا یان هەر بە خولیای پاتەوەکردنی ئەو کارەی نالی، چامەیەکی ۱٦ دێڕی بۆ ناتیق ئەنووسێ و ناتیقیش بە هەمان شێوەی سالم وەڵامی کەمالی ئەداتەوە. ئەوەی کارتێکەریی نالی و سالم زەقئەکاتەوە، کەڵکوەرگرتن لە هەمان چەمک

[۱] خوێنەری تامەزرۆ بۆ خوێندنەوەی زۆرتر لەسەر ئەم سێ دێڕەشیعرە ئەتوانێ بڕوانێتە کتێبی «چەپکێک لە گوڵزاری نالی» مەسعوود محەمەد، لاپەڕەکانی ٤-۱۳۳.

و بابەتگەلی نالی و سالم لە چامەکانی کەمالی و ناتیقە. بە کورتی ئاماژە بەو کاریگەریانەی نالی وەکوو ژێردەق بەسەر کەمالییەوە وەکوو ژووردەق دەکەین. دەستپێکی چامەکەی نالی ئەم بەیتەیە:

قوربـانی تـۆزی ڕێگـەتم ئـەی بـادی خۆش‌مـروور
وەی پەیکی شـارەزا بـە هـەموو شـاری شـارەزوور
(نالی، ١٣٨٧: ١٨٤)

چامەکەی کەمالی بەم دێڕەوە دەستپێدەکا:

دەخیلی بەختتم ئەی بـادی خۆش‌خەرامـی سەبـا
لەباتـی بەنـدە بـڕۆ بـۆ هەڵەبجـە تۆ ئێستـا
(ئاوارە، ١٩٨٥: ٣٩)

لێرە بەڕوونی کاریگەریی ژێردەقی نالی بەسەر ژووردەقی کەمالی‌دا دەبینین. کەڵک‌وەرگرتن لە وشەی «با» و ڕۆیینی بۆ زێدی شاعیر ئەم کارتێکەرییە زەق‌دەکاتەوە. ئاماژەیەکی دیکە بەم کاریگەرییە شیعرییەی نالی، بەتەواوی مەبەستەکەمان ئەپێکی. نالی دەڵێ:

ئـایـا بـە جـەمع و دائرەیـە دەوری «کـانی بـا»
یـاخـۆ بـووە بـە تـەفـرەقە و شـۆڕش و نشـوور
(نالی، ١٣٨٧: ١٩٥)

کەمالی-ش بە هەمان شێوە دەڵێ :

بـە ڕۆژی جـومعە ئەچن بـۆ «گـوڵان» و «کـانی شێخ»
بچـووک و گـەورە و بـە شـەوق و بـەزم و سـەفا؟
(ئاوارە، ١٩٨٥: ٤١)

نالی هەواڵی «کانی با» دەپرسێ کە سەیرانگایەکی خۆشە لە سلێمانی و کەمالی-ش هەر بەو شێوە هەواڵی دوو کانی و شوێنی سەیرانی هەڵەبجەییەکان لە ناتیق ئەپرسێ، «کە ڕاگوزەری کەمالی خۆی بوون، وەک شارەزای مەیدانی ئەو ناوچەیە، دێت و ناوچەکە دەستنیشان‌دەکا... کە هەر دوو جێگا یەکەم نەزەرگان و دووەم وەکوو «کانی با»کەی سلێمانی جێ سەیران و ئاهەنگ و ڕابواردنی خۆشی دانیشتووانی هەڵەبجە بوون» (٤١).

نالی شیعرێکی هەیە کە بە تەنزێکی شیرینەوە باسی کەرەکەی ئەکا کە لەدەستی‌چووە و بە هەمان شێوە قانع پارچە شیعرێکی بە باڵای کەردا گوتووە. دەتوانین بڵێین نالی یەکەم کەسە لە زمانی کوردیدا بەم شێوە تەنزە و بەو جۆرە شیعر دەڵێ و هەر بەم بارەشدا وەکوو ژێردەقێک دەردەکەوێ. یەکەم دێڕی شیعرەکەی نالی وەهایە:

هەی کەرێکم بوو، چ پەیکەر؟ تەی‌کـەری هەوراز و لێژ
سینـە پـان و مووجـە کـورت و شـانە بـەرز و گـوێ درێژ
(نالی، ١٣٨٧: ٢٣٦)

هەروەها یەکەم دێڕی شیعرەکەی قانع بەم شێوەیە دەستپێدەکا:

هەی بۆ کەرێ قەڕابە سەر، دەشت تەی کەرێکی باسیەر
گــوێ کـورت و پــان و نێرەکـەر، کوڵکن کلۆک و بارەبـەر
(قانع، ١٣٩٦: ١١٩)

تەخمیسی شیعری شاعیرانی پێشوو شێوەیەکی خۆتاقی‌کردنەوەی ئاستی شیعریی شاعیری نوێتر لەگەڵ شاعیری پێشووە؛ واتا، لێرەدا ژووردەق ڕکابەری ژێردەق دەکا و بە هێنانەوە و لێکدانەوەی بەشێک لە ژێردەق لە نێو خۆدا، هەم ژێردەق زیندوو دەکاتەوە و ئەم خۆی دەردەخا. تەخمیسێکی شیعری نالی لە لایەن سەید باقر هاشمی کراوە و بەشێکی ئەمەیە:

بـوومـــە فـەرهـــادی ئـەتـــۆ و داوێنـــی کێـــو
جێگـەمـــە و یـــارمـــ قۆڵـەنـگ و بـــەرد و چێـــو
شێت و ســـادارمـــ، کـــــەسێ نـامکـــا بەخێـــو
ئـاوی سوێـــری چـــاو و بـــاری تاڵـــی لێـــو
سوێـــر و تـاڵـــی دەمدەمـــ و ژەمژەمـــ دەخـــۆمـــ
(هاشمی، ٢٠٠٦: ١٩١)

نالی بێجگە لە شاعیرانی کلاسیک، کاریگەریی زۆری هەبووە لەسەر شاعیرانی نەوەی نوێ، کە چوارچێوە و فەزای شیعرییان زۆر جیاوازە لە ئەوەی نالی و بۆ ئەمانیش دەوری ژێردەق دەبینێت. بە دڵنیاییەوە تەواو شاعیرانی کلاسیکی کرمانجیی ناوەڕاست، بەبێ سێ‌ودوو، لە ژێر کاریگەریی نالی‌دان و ئەمەمان بە قامک خستنەسەر شیعری هەندێ لەو شاعیرانە سەلماند و ئێستا نۆرەی شاعیرانی شیعری نوێیە، کە ئاماژە بە شیعری هەندێکیان ئەوەمان بۆ ئەسەلمێنێ کە نالی هەر ئێستاش ژێردەقێکی گرینگە و لە زۆر بواردا ڕەچاو دەکرێت. لێرەدا قاڵب و چوارچێوەی شیعری شاعیرەکان لەسەر ڕێبازی گۆران گۆڕدراوە و ئەوەی کلاسیک نییە، واتا غەزەل و قەسیدە و هتد، لە بواری ناوەرۆکیشەوە بە هەمان شێوە جیهانێکی جیاوازیان هەیە. بەڵام سەیر ئەوەیە کە ئەم ژووردەقانە ئەگەر کاریگەریی نالی بەسەریاندا دیاریش نەبێ، بۆخۆیان ئەیدرکێنن کە چرای ڕێگەیان نالی‌یە، بە تایبەت هاوسەنگی و هاوپلەوپایەی نالی لە شیعری نوێی کوردیدا، واتا شێرکۆ بێکەس، بە ئاشکرا نالی بە مامۆستا ناولێدەبا و ئەمە سەلمێنەری ئەو ڕاستییەن کە ڕێبازی نالی و ئاوەڵانی درێژەی هەیە و بەردەوامە و نالی بۆ خۆی ئوستوورەدەق و چرای ڕێگەیە.

شێرکۆ بێکەس لە وتارێکدا بەناوی «نالی تەئویلی بەرزی شیعری کوردی!» بە ڕاشکاوی باس لە چۆنیەتیی کاریگەریی نالی بەسەر ژیان و شیعرەکانییەوە دەکات. ئەو دەڵێ «لە بیرمە هێشتا شیعرم مناڵێکی شەرمنی تازە پێرەوکە و دارەبەدارەی ناو داڵانی بۆنخۆشەکەی زمانی کوردی بوو؛ بەڵام چاوێکی هەر لە لای گەورەشیعرێکی تەوێڵ‌بەنووری کەڵەگەتی سەرلەهەورچەقیوی ئەم وڵاتی گوڵ و خۆڵەمێشە بوو... ئەو بە بەرزیەوە و ئێمەش لەو نزمییەدا» (بێکەس، ٢٠٠٦: ٤٧). سەرنج بدەین بە دواهەمین ڕستەکەی، هەستی شێرکۆ بۆ نالی‌مان بۆ دەردەکەوێ و ئەمە بێ‌ڕووشکێنی و خۆشکێنییە و لە زۆر جیگادا شێرکۆ پاتەوەی‌دەکاتەوە کە بەکورتی ئاماژەی‌پێدەکەین. دواتر وەها

ئاستی نالی و خۆی و ئاوەڵانی دەشوبهێنێ: «ئەو پیرەمەگروونێ لە هونەر و ئەفراندن و ئێمەش کۆمەڵە بنچکێ لە دامێنی چاولێکەریدا... لە هەر گۆشەیەکەوە سەرت بۆ دنیای شیعری کوردی بەرزبکردایەتەوە، ئەو هەڵگوردی شیعرەت بەدیئەکرد!» (٤٧). شێرکۆی مەزن لەم وتارە بەپێز و چێژبەخشەیدا کە لە واقیعدا پەخشانە شیعرە و نەک وتارێکی ئاسایی، ئەوەندە جوان و ئەفسووناوی باسی نالی دەکا کە سەد هێندە ئەڤینی ئەم کەڵە شاعیرە دەچەسپێتە ناخی دڵەوە.

شێرکۆ هەمتر دەڵێ: «نالی لە قووڵاییا ئەژیا، لە قووڵایی وشە و مانیشدا، نالی ڕواڵەتی بەلاوەنا و بە چیای سەختی زمان و داڕشتنی تازەدا هەڵزنا». «ئێمە هەموومان شاعیران و عاشقان مەڵاشووی وشە و خۆشەویستیمان بە پەنجەی نالی هەڵدراوەتەوە؛ بەو مانایەی سەرمان لە هێلانەی ئەو زمانەدا جووقاوە، کە خوڵقێنەری یەکەمی بوو» (٤٧-٨٠). شێرکۆ بۆخۆی باس‌دەکا کە قەسیدەی «یەکەم سەفەر» و هەروەها کتێبی *دەربەندی پەپوولە*ی کە بەڕاستی لووتکەی شیعرییەتی، بۆ نالی وتراوە. «لە ساڵی ١٩٩١دا خولیای گەیشتنەوە بە دیدارێکی ئەم حەزرەتە لە تاراوگەی سویددا بوو بە گەردەلوولێک لە سەرمدا و ئەمجارەیان *دەربەندی پەپوولە* بوو بە دەربەندی غوربەتی نالی» (٥٢). ئێستا بۆ کۆتایی باسی کارتێکەریی شێرکۆ لە لایەن نالییەوە چەند بەشێک لە *دەربەندی پەپوولە* ئەهێنینەوە:

نامۆیی سەراپــای تەڕبـــووە
بەلــەمـــی بـێ کــــەنـــار
تەنیــــایــــی ئــەئـــاژوێ و
بـاخـــــــــــــی ئــــاو
گـوڵ‌قژی «حەبیبە»ی گرتووە
(بێکەس، ٢٠١٦: ١٤)

لێرە شێرکۆ وەکوو ژووردەق لە ژێردەقەکەی نێوی دڵدارە مەنشورەکەی، واتا «حەبیبە»ی وەرگرتووە و چەند دێڕ دواتریش زێدەکەی نالی واتا «خاک‌وخۆڵ» و هەروەها شاری دوورکەوتوویە خۆخواستەکەی لە نێو ئەم شیعرەدا سەرهەڵدێنێ:

دووریێتیــــــی: نـــزیـــک و
قیبلـەکـەی: «خــاک‌وخۆڵ»
«ئەستەمووڵ» ئەبینی و نازانێ چ گۆمێ
وا لـە ژێـــر کڵاوی ئەم پیـاوە
ڕیش ڕەشەڕێحانە و بەفـرەدا
(١٥)

هەروەها لە شوێنێ تر باسی ئەوە دەکا کە ئەگەر بگا بە نالی، چی ئەڵێ. باسەکە زۆر درێژە و بەشێکی چکۆلەی لێرە ئەهێنین. شێرکۆ دەڵێ:

پێی ئەڵێم:
گەورەی من!
پێم ناڵێی ئەو هەودا و گزنگی چاوانەت
چۆن ئەکەیت بە دەرزیی حەرفەوە
بۆ ئەوەی خەم بدروویت
بە بالای حەبیبە و عیشقەوە؟!
(۱٤۹)

لە شیعرەکانی سەرەوە چەمکگەلێکی پەیوەندیدار بە نالییەوە هاتووە، بەڵام سەرەڕای ئەم جۆرە ئاماژانە، شێرکۆ ڕاستەوخۆ بە ڕێکخستنی هەندێ وێنە تیشک ئەخاتە سەر گەورەیی نالی. بەم جۆرە:

نازانم پێشوازیی عاشقێ لە خۆری عاشقان چۆن ئەکرێ؟
نازانم پێشوازیی غەریبێ لە مانگی غەریبان چۆن ئەکرێ؟
نازانم ئەو وەختەی گەڵایەک
ئەگاتە بەردەمی زریانێ چی ئەڵێ؟
یان تاقە دڵۆپێ لە ئەوین
ئەو وەختەی ئەگاتە
زەریایەک لە ئەوین... چی ئەڵێ؟!
...
... بەڵێنە هەر ئەمشەو درەنگان دووقۆڵی
لە کەنار ئەو گۆمە غەمگینەی تەنیشتمان:
من و مەلاخدری ئەحمەدی شاوەیسیی مکایلی پێکبەگەین:
...
پێی ئەڵێم:
بێ گومان ... سەروەرم! ... بێ گومان
وشەی تۆ قووڵترە
حەرفی تۆ گەشترە
دەنگی تۆ پڕترە... بێ دەعوام، پەتکیش نیمە!
(۱٤۹-۱٤۳)

شاعیرێکی دیکە لە بەرەی نوێخواز کە جێگەی ئاماژەیە، کەژاڵ ئەحمەدە، کە پێی ناوەتە جێ‌پێی شێرکۆ بێکەس-ەوە و پارچە شیعرێکی بە ناو «لە دەنگتدا بمنێژە»ی وەکوو پێداهەڵگوتنێک بۆ نالی داناوە کە قامک دەنێنە سەر هەندێ شوێنی:

بــۆن دێ، بۆنـــی خۆشـــی نالـــی
لە سنگ و بەرۆکـی واڵای غەریبـان
... زەردەشتـــە و بـەبــێ ئاڤێستـــا
کــــــوشتمی...
... خۆزگــە ئەمتوانـــی پێی بڵێمــ:
لـــــــــە دەنگتـــا بمنـێـــژە
یــان لـــــــــە ئـاوازێکتـــــا...
سەد دڵمـــ پێویستـــە بـــۆ دڵمـــ
بـــۆ ئـــەوەی شیعرمـــ بـاستکـا
شەرمنـە زمانـــی ڕۆژانەی شـاعیران
(٢٠٠٦: ٩٥-٩٨)

هەروەها دەڵێ:

لـــە نێوانـــی شێرکـــۆ بێکـــەس و نالیـــدا
تا بزانم وەک دیوانی *دەربەندی پەپوولە* ئەڵێ:
« ئـەمشـــەو درەنگـــان دووقـــۆڵـــــی
لە کەنـار ئـەو گـۆمـە غەمگینـەی تەنیشتمان»
ئـەو لـووتکـانـــــە بـەیـــەکگـەیشتـــن
یاخـــود نـا؟
(١٠٠)

و لە کۆتاییدا دەبێ بەم بەشەش ئاماژە بکەین:

نـازانمـــــ مـــن بـۆچـــــی نـەڵێمـــــ:
کە هەڵپرووکاوە پرسیارێکی حەبیبە لە چاوما
چـۆنە یـاری
هــــــەرگیـــز نەگەڕایـــەوە بـــۆ بـــەر
سێبـەرێکی خـــانومـانی خـــاکوخـــۆڵ؟
نـەهــــاتـەوە بـــــــۆ شـــــارەزوور؟
(١٠٠)

لێرەدا بە هێنانەوەی چەمکگەلێک وەکوو «حەبیبە»، «خاکوخۆڵ» و «شارەزوور» بە نامە مەنشوورەکەی نالی بۆ سالم ئاماژەدەکا و دەوری خۆی وەکوو ژووردەقێکی دیار زۆرتر دیاریدەکا.

شاعیرێکی سەردەمی ئەمڕۆ، شوعەیب میرزایی، کە لە بواری زمان و جیهانی شیعرییەوە لە نالی وەکوو شاعیرێکی کلاسیک کە هیچ، بەڵکوو لە زۆربەی شاعیرانی نوێخوازی پێش خۆیشی دوورە،

بەڵام سەرەڕای ئەم دوورییە، ئەبینین نالی و پارچە شیعرەکەی بۆ مەستوورە لە شیعری ئەم شاعیرەدا زەق ئەبێتەوە و باری ئێرۆتیکەکەی بەرچاوتر و ڕاشکاوانەتر دەردەکەوێ:

ڕۆژێ شەقــە شەرقییــەکانمـــــــ
لە شەقێکما مەستوورەم هەڵگرتووە
نالــی تـەجــاوزی پـــێ نەکـــــا
(۱۳۹٤: ۲۷)

هەروەها دەڵێ:

وەختـــێ لـــــەدەس ئـەچــــووی
ژنانەیی مەستوورە بووی دوای نالی
(۲۸)

دواتر دەڵێ :

مـەستـــــــوورە لـــــە نـالیـــــــا
سنــەی سینەکـــــانی فەوتـــــــا
(۳۰)

**۴- ئەنجام**

دیوانی نالی وەکوو بەرهەمێکی بەجێماو لە نالی-ی شاعیر، بوو بە بابەتی لێکۆڵینی ئەم وتارەی پێش دەستان و شیمانکردەوە کە ئاخۆ دەکرێت وەکوو ئوستوورەدەقێک لە چاند و ئەدەبیاتی کوردیدا ناوزەد بکرێت. هەر چاند و زمانێک بۆ مانەوە و گەشەکردنی، پێویستی بە چەشنە دەقگەلێکە کە هەمیشە لە لایەن هۆنەرانەوە وەکوو دەقێکی بەرچاو بێت و هەمیشە دەستکەوتەکانی ڕەچاوبکرێت و بە ڕاشکاوی یان شاراوەیی و ناخۆئاگا لە ژێر کاریگەریدا بن. ئاشکرایە کە پێداچوونی تێروتەسەل لە مەودای وتارێکدا ناگونجێ و هەوڵێکی بەرفراونتر و قووڵتر و وردبینانەتری پێویستە، کە لێرەدا بۆ نووسەر نەلواوە. بۆ پێکانی ئەم مەبەستە، لە مێتۆدی باڵادەقێتی ژێرار ژێنێت، بیرداڕێژی فەرەنسی، کەڵکمان وەرگرت. لەم مێتۆدەدا دوو زاراوەی گرینگ هەن کە بوون بە پێوەری وتاری ئێستا، کە وروژاندنی چەمکگەلی ژێردەق و ژووردەقە. ژێردەقێک کە ئەژماری ژووردەقەکانی زۆر بێ، شیاوی ئەوەیە بە ئوستوورەدەق ناوی لێببرێت.

بۆ وروژاندنی ئەم باسە دەقی دیوانی نالیمان وەکوو ژێردەقێک لە ژێر سێ خاڵدا شیکردەوە. نالی سەرەتا سەبارەت بە بابەتی زمان، داڕێژەری ڕێچکەیەکی نوێ لە زاری کرمانجیی ناوەڕاستە و یەکەم کەسیشە کە تێکۆشاوە بناغەی زمانێکی ئەدەبیی یەکگرتوو و پێوەر دەستەبەربکات. ئەم هەوڵەی نالی لە لایەن زۆرینەی شاعیرە بەرزەکانی پاشیەوە درێژەیپێدرا و ئێستا گەشەی زۆری کردووە. شێوازی نالی کلاسیکە و ناکرێ شاعیرە کلاسیکەکانی پاش ئەو، بەتەواوی لەژێر کاریگەریی ئەودا دابنێین؛ چونکە پێش نالی، لە ئەدەبی فارس و عەرەب هەر بەم شێوازە شیعریان گوتووە و لە زارەکانی دیکەی کوردیشدا کەڵکی زۆریان لەم شێوازە بینیبوو. لە کۆتاییدا باسەکەمان هێنایە سەر

ناوەرۆکی شیعرەکانی نالی و لەم ئاقارەدا بە نموونەگەلی مەنشوور و دیار لەو ژووردەقگەلەی کە پێوەندیی زۆر زەقیان لەگەڵ شیعرەکانی نالی‌دا هەبوو، ئاماژە کرا؛ بەتایبەت لە شیعری نوێدا، کە جیاوازی جیهانبینی و فەزای شیعرییان لەگەڵ نالیدا زۆرە، چەند نموونەمان هێنا کە بەرچاوترینیان شێرکۆ بێکەس بوو. بە هەر شێوە، بەپێی توان و دەرفەتێک کە بوومان و بۆمان ڕەخسا، لێکۆڵینەوەی ئەم بابەتەمان کرد و بەو ئەنجامە گەیشتین کە بە دڵنیاییەوە دیوانی نالی شیاوی ئەوەیە کە وەکوو ئوستوورەدەقێک ڕەچاوبکرێت و مامۆستا هێمن گوتەنی، شیاوی ئەوەیە وەکوو چۆن دەڵێن دەبێ هەر فارسێک دیوانی حافزی لە بن قورئاندا هەبێ، دەبێ لە نێو کتێبخانەی هەموو ماڵە کوردێک دیوانێکی نالی ببێ و بخوێنرێتەوە.

## سەرچاوەکان

### کوردی:


بێکەس، شێرکۆ (٢٠٠٦). «نالی تەوێڵی بەرزی شیعری کوردی!». زنجیرە کتێبی گۆڤاری *کۆچ*، س. ٣، ژ. ٦، لل. ٤٧-٦٣.

--- (٢٠١٦). *دەربەندی پەپوولە*. سلێمانی: ناوەندی ئەندێشە، چاپی سێیەم.

پیرەمێرد (١٣٨٦). *دیوانی پیرەمێرد*. سەقز: بڵاوگەی محەمەدی، چاپی دووەم.

حەداد، عەبدوڵڵا (٢٠٠٦). «ژیاننامەی نالی و گرنگیەتی سەرچاوەی بیانی و چەپکێک سەرنج». زنجیرە کتێبی گۆڤاری *کۆچ*، س. ٣، ژ. ٦، لل. ٢٥-٤٦.

ڕوخزادی، عەلی (٢٠٠٦). «نالی و سەبکی هونەری و شیعری ئەو». زنجیرە کتێبی گۆڤاری *کۆچ*، س. ٣، ژ. ٦، لل. ١٣٧-١٥٢.

سالم (٢٠١٥). *دیوانی سالم*. سلێمانی: بنکەی ژین.

قانع (١٣٩٦). *دیوانی قانع: شاعیری چەوساوەکانی کوردستان*. تاران: بڵاوگەی پانیز، چاپی نۆهەم.

قەرەداغی، محەمەدعەلی (٢٠٠٦). «با لە دەرەوەی وڵات خەمێکی نالی بخۆین». زنجیرە کتێبی گۆڤاری *کۆچ*، س. ٣، ژ. ٦، لل. ٣٧٩-٣٩٥.

کۆیی، حاجی قادر (١٣٩٦). *دیوانی حاجی قادر کۆیی*. بانە: چاپەمەنیی مانگ.

محەمەد، مەسعوود (١٣٩٦). *چەپکێک لە گوڵزاری نالی*. بانە: چاپەمەنی مانگ.

محەمەدعزیز، حوسێن (٢٠٠٥). *سەلیقەی زمانەوانیی و گرفتەکانی زمانی کوردی*. هەولێر: بەڕێوبەری گشتی چاپ و بڵاوکردنەوەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، چاپی دووەم.

میرزایی، شوعەیب (١٣٩٤). *گورگەکانی خانمی ١٩٦٨ و شەوێ*... ناشوێن.

مەحوی (١٣٨٧). *دیوانی مەحوی*. سنە: بڵاوگەی کوردستان، چاپی پێنجەم.

مەلا ساڵح، حەکیم (٢٠١٣). «جارێکی دی لەگەڵ حەزرەتی نالی». زنجیرە کتێبی گۆڤاری *کۆچ*، س. ١٠، ژ. ١٨-١٩، لل. ٢٣٥-٢٥٤.

نالی (١٣٨٧). *دیوانی نالی*. سنە: بڵاوگەی کوردستان، چاپی شەشەم.

نووری عومەر کاکی، حەمە (٢٠٠٨). *شێواز لە شیعری کلاسیکی کوردیدا*. سلێمانی: مەڵبەندی کۆردۆلۆجی.

هاشمی، سەیدباقر (٢٠٠٦). «پێنجخشتەکی لەسەر شیعری نالی». زنجیرە کتێبی گۆڤاری *کۆچ*، س. ٣، ژ. ٦، لل. ١٩٩-١٨٨.

ئاوارە، ساجد (١٩٨٥). *نامەی ژیان*. بەغدا: چاپخانەی ئیرشاد.

ئەحمەد، کەژاڵ (٢٠٠٦). «لە دەنگتدا بمنێژە». زنجیرە کتێبی گۆڤاری *کۆچ*، س. ٣، ژ. ٦، لل. ٩٦-١٠٢.

**فارسی:**

آلن، گراهام (١٣٨٩). *بینامتنیت*. ترجمه پیام یزدانجو، تهران: نشر مرکز، چاپ سوم.

کالر، جاناتان (١٣٨٨). *بوطیقای ساخت‌گرا: ساخت‌گرایی، زبان‌شناسی و مطالعه‌ی ادبیات*. ترجمه کوروش صفوی، تهران: انتشارات مینوی خرد.

لچت، جان (١٣٨٣). *پنجاه متفکرمعاصر: از ساختارگرایی تا پسامدرنیته*. ترجمه محسن حکیمی، تهران: انتشارات خجسته، چاپ سوم.

نامورمطلق، بهمن (گردآورنده) (١٣٨٧). *اسطوره‌متن هویت‌ساز: حضور شاهنامه در ادب و فرهنگ ایرانی*. تهران: شرکت انتشارات علمی و فرهنگی.